# لە مردن مەترسە

عیسا پێی گوت: «من زیندووبوونەوە و ژیانم، ئەوەی باوەڕم پێی هەبێت، هەرچەندە مردووە، بەڵام دەژی، هەرکەسێک زیندوو بێت و باوەڕم پێی هەبێت هەرگیز نامرێت... یۆحەنا ١١: ٢٥-٢٦



# 1 خودا تۆی خۆش ئەوێ

لەبەر ئەوەی خودا ئەوەندە جیهانی خۆشویست، تەنانەت کوڕە تاقانەکەی بەختکرد، تاکو هەرکەسێک باوەڕی پێ بهێنێت لەناو نەچێت، بەڵکو ژیانی هەتاهەتایی هەبێت، یۆحەنا 3:16

دز نایەت بۆ دزین و کوشتن و لەناوبردن نەبێت. بەڵام من هاتووم تاکو ئەوان ژیانیان هەبێت، ژیانێکی پڕ و تەواو. یۆحەنا 10:10

# 2 ئادەمیزاد لەلایەن سروشتەوە گوناهبارە. کەواتە ئەو لە خودا جیاکرایەوە.

لەبەر ئەوەی هەمووان گوناهیان کرد و لە شکۆی خودا دوور کەوتنەوە و ڕۆما 3:23

چونکە کرێی گوناە مردنە، بەڵام دیاری خودا ژیانی هەتاهەتاییە کە لە ڕێگەی عیسای مەسیحی خاوەن شکۆمانەوەیە. ڕۆما 6:23

وەک بۆ مرۆڤ دانراوە جارێک بمرێت، دواتر لێپرسینەوەیە، عیبرانییەکان 9:27

بەڵام ترسنۆک و بێباوەڕ و قێزەونان، هەروەها بکوژ و داوێنپیس و جادووگەر و بتپەرستان، لەگەڵ هەموو درۆزنان، بەشیان لە دەریاچەی بە ئاگر و گۆگرد داگیرساوە کە مردنی دووەمە. ئاشکراکردن 21:8

ئەگەر مرۆڤ بەهۆی گوناهەکەیەوە لە خودا جیاببێتەوە، چارەسەری ئەم کێشەیە چییە؟ ئێمە زۆرجار ئەمانە بە چارەسەر دەزانین: ئایین، کاری باش، ڕەوشت هەرچۆنێک بێت، تەنها یەک چارەسەر هەیە کە لەلایەن خوداوە دابین کراوە.

# 3 عیسای مەسیح تاکە ڕێگایە بۆ ئاسمان.

عیساش پێی فەرموو: «منم ڕێگا و ڕاستی و ژیان. کەس نایەتە لای باوک لە ڕێگەی منەوە نەبێت. یۆحەنا 14:6
ئەوەی باوەڕ بە کوڕەکە بهێنێت ژیانی هەتاهەتایی هەیە. بەڵام ئەوەی گوێڕایەڵی کوڕەکە نییە ژیان نابینێت، بەڵکو تووڕەیی خودای لەسەر دەمێنێت. یۆحەنا 3:36

# 4 عیسای مەسیح تاکە ڕێگایە بۆ ئاسمان

لەبەر ئەوەی بە نیعمەت ڕزگارتان بوو لە ڕێگەی باوەڕەوە، ئەمەش لە خۆتانەوە نییە، بەڵکو دیاری خودایە، بە کردار نییە، تاکو کەس شانازی نەکات. ئەفەسۆس 8:2-9

ئەم نوێژە بە باوەڕی خوا بڵێ:
ئەی یەزدان، زۆر سوپاس بۆ خۆشەویستی مەزنت بۆ من. من دانی پێدادەنێم کە من گوناهکارم و داوای لێخۆشبوون دەکەم. سوپاس بۆ مردنت لەسەر خاچەکە بۆ ئەوەی سزاکە بدەیت بۆ گوناهەکانم من باوەڕم بە زیندوو بوونەوەت هەیە لە مردووان. لە ئێستاوە، من وەک پەروەردگارم و ڕزگارکەرم متمانەت پێ دەکەم. من دیاری ژیانی هەتاهەتایەت قبوڵ دەکەم و ژیانم تەسلیمی تۆ دەکەم. یارمەتیم بدە گوێڕایەڵی فەرمانەکانت بم و لە چاوتدا دڵخۆش بم. ئەی ئێم ئی ئێم

خواستی باوکم ئەمەیە: هەرکەسێک تەماشای کوڕەکە بکات و باوەڕی پێ بهێنێت ژیانی هەتاهەتایی دەبێت، منیش لە ڕۆژی دواییدا زیندووی دەکەمەوە. یۆحەنا 6:40
خودای باوک ئەوەی لە دەسەڵاتی تاریکی دەربازی کردین و ئێمەی بۆ شانشینی کوڕە خۆشەویستەکەی گواستەوە، بە یەکبوون لەگەڵ ئەودا کڕدراینەوە، واتە لێخۆشبوونی گوناهمان وەرگرت. کۆلۆسی 1:13-14
کەواتە ئەگەر هەرکەسێک لەگەڵ مەسیحدا ببێتە یەک، دەبێت بە بەدیهێنراوێکی نوێ، شتە کۆنەکان بەسەرچوون و شتی نوێ هاتووە! دووەم کۆرنسۆس 5:17
لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەوانەی پێشوازییان لێکرد، ئەوانەی باوەڕیان بە ناوی هێنا، مافی پێدان ببنە ڕۆڵەی خودا، یۆحەنا 1:12

# ئەنجامدانی کارە باشەکان مانای ڕزگاری نیە، بەڵکو بەڵگەی ڕزگاری ئێمەیە.